# ئەو دوو پیتانەی بەیەکتر دەگەن

## الحرفان الـملتقيان

وەکو یەکن
متماثلان

هاوڕەگەزن
متجانسان

لەیەکتر نزیکن
متقاربان

لە یەکتر دوورن
متباعدان

**دوو پیتی وەك یەك**
**الحرفان المتماثلان**

ئەو دوو پیتانەن کەوا لە شوێنی دەرچوون و ئاوەڵ (سیفەت) دا یەکن. وەکو:

﴿رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمۡ -وَلۡيَكۡتُب بَّيۡنَكُمۡ -بَل لَّا تُكۡرِمُونَ﴾

هما الحرفان المتفقان في المخرج والصفات.

نحو: ﴿رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمۡ -وَلۡيَكۡتُب بَّيۡنَكُمۡ -بَل لَّا تُكۡرِمُونَ﴾

**دوو پیتە هاورەگەزەکان**
**الحرفان المتجانسان**

ئەو دوو پیتانەن کەوا لە شوێنی دەرچوون و ئاوەڵ (سیفەت) دا یەکن. وەکو:

﴿قَد تَّبَيَّنَ -هَمَّت طَّآئِفَتَانِ -يَلۡهَث ذَّٰلِكَ - أَثۡقَلَت -دَّعَوَا﴾

هما الحرفان المتفقان في المخرج والصفات.

نحو:

﴿قَد تَّبَيَّنَ -هَمَّت طَّآئِفَتَانِ -يَلۡهَث ذَّٰلِكَ -أَثۡقَلَت دَّعَوَا﴾

# بنچینه ( بناغه )

## قاعدة

- زانایانی قورئان خوێن ڕێك كەوتوون لەسەر ئەوەی كە واجبو پێویستە دوو پیتی هاو وێنەو دوو پیتی هاو ڕەگەز تێكهەڵكێشبكرێن و لێكبدرێن وە واجبو پێویستە دوو پیتی لەیەك دوور بەدیار بخرێن و لەیەك نەدرێن و رایان جیاوازە لەسەر واجبیەتی لێكدانی دوو پیتی لەیەك نزیك.
- إتفق القراء على وجوب الإدغام في الحرفين المتماثلين والمتجانسين واتفقوا على وجوب الإظهار في الحرفين المتباعدين واختلفوا في وجوب الإدغام في الحرفين المتقاربين

- ئەگەر دوو پیتی هاووێنەو وەك یەك یان هاوڕەگەز بەیەك گەیشتن- وە پیتی یەكەمیان زەنەدار ( سكونەدار ) بوو- ئەوە واجبو پێویستە تێكهەڵبكێشرێن و لەیەكبدرێن.

**نموونە :** ﴿رَبِحَت تِّجَـٰرَتُهُمْ -وَلْيَكْتُب بَّيْنَكُمْ - هَمَّت طَّآئِفَتَانِ- قَد تَّبَيَّنَ ﴾

- إذا التقى حرفان متماثلان أو متجانسان-والأول منهما ساكن- وجب الإدغام.

**نحو:**

﴿رَبِحَت تِّجَـٰرَتُهُمْ -وَلْيَكْتُب بَّيْنَكُمْ - هَمَّت طَّآئِفَتَانِ- قَد تَّبَيَّنَ ﴾

# تێکهەڵکێشان

## الإدغام

**بریتیە لە بەیەکگەیاندنی پیتێکی زەنەدار (سکونەدار) بە پیتێکی نەجوولاو بەشێوەیەك دەبن بەیەك پیتی تووندکراو (شەدەدار) لەڕەگەزی پیتی دووەم کەبەیەك جار شوێنی دەرچووونیان بۆ دەجوولێنێ و بەرز دەبێتەوە.**

**هو إيصال حرف ساكن بحرف متحرك بحيث يصيران حرفاً واحداً مشدداً من جنس الثاني يرتفع عنهما المخرج ارتفاعةً واحدة**

**تێکهەڵکێشانی ناتەواو لە دوو پیتی هاوڕەگەز**
**الادغام الناقص في الحرفين المتجانسين**

ئەوە ئەگەر هاتوو لە هەردوو پیت یەکەمیان داخراوبێت. نموونە ﴿أَحَطتُ -بَسَطتَ -فَرَّطتُم﴾ بەشێوەیەك شوێنی دەرچوون دادەخرێ لەسەر پیتی یەکەم بەبێ هەژان وە لەسەر پیتی دووەم دەکرێتەوە.
وذلك إذا كان الحرف الأول منهما مطبقاً. مثال ﴿أَحَطتُ -بَسَطتَ -فَرَّطتُم﴾ حيث ينطبق المخرج على الحرف الأول من غير قلقلة وينفتح على الحرف الثاني.

**ئاگاداری**
**تنبيه**

ئەوەی کە جیا دەکرێتەوە لە تێکهەڵکێشانی دوو پیتی هاووێنە ئەگەر هاتوو پیتی یەکەمیان پیتی درێژ کردنەوەبێت ئەو تێکهەڵناکێشرێن:
يستثنى من إدغام الحرفين المتماثلين ما إذا كان الأول منهما حرف مد.
نحو :

﴿فِي يُوسُفَ -فِي يَوْمٍ -ٱصْبِرُوا۟ وَصَابِرُوا۟ وَرَابِطُوا۟ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾

# دوو پیتی لەیەکنزیك
## الحرفان المتقاربان

**ئەو دوو پیتانەن کە لەیەکنزیکن لە شوێنی دەرچوون و سیفەتیان.**

**هما الحرفان المتقاربان في المخرج والصفات.**

**نحو:** ﴿ قُل رَّبِ –نَخلُقكُّم –فَقَدْ ضَلَّ –كَذَّبَتْ ثَمُودُ –وَإِذْ زَيَّنَ ﴾

**تێکهەڵکێشانی دوو پیتی لەیەکنزیك**
**إدغام الحرفين المتقاربين**

**هەیە جێگەی یەکدەنگی زانایانە**
**موضع إتفاق**

**هەیە جێگەی راجیاوازی یە**
**موضع إختلاف**

# ئەو شوێنانەی کە زانایان لەسەری کۆکن لە تێکھەڵکێشانی دوو پیتی لێکنزیك

## المتفق عليه من إدغام الحرفين المتقاربين

١- **لامی زەنەدار ( سکوندار ) لە را وەکو:** ﴿قُل رَّبِّ﴾

**اللام الساكنة في الراء نحو :** ﴿قُل رَّبِّ﴾

٢- **قافی زەنەدار ( سکوندار لە کاف وەك :** ﴿نَخْلُقكُّم﴾

**القاف الساكنة في الكاف نحو:** ﴿نَخْلُقكُّم﴾

٣- **لامی شەمسی لە ١٣ پیت. نموونە :** الشّمس ، النبيّ، التّوراة، الصّراط

**اللام الشمسية في ١٣ حرف**

٤- **نونی سکوندارو تەنوین ( دوو لەبەرو دوو لەسەرو دوو لەژێر ) لە پیتەکانی : لم يرو.**

**النون الساكنة والتنوين في حروف : لم يرو**

# ئەو شوێنانەی کە زانایان لەسەری جیاوازن لە تێکهەڵکێشانی دوو پیتی لێکنزیك

## المختلف فيه من إدغام الحرفين المتقاربين

ئەمەش لە زانستی (قراءات- خوێندنەکان) لێ دەکۆڵرێتەوە.

وەکو تێکهەڵکشانی دال لە ضاد ﴿فَقَدْ ضَلَّ﴾ وە تێکهەڵکشانی تاء لە ثاء

وەکو: ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ﴾ وە خوێندنەوەی (حفص) لە لایەن (عاصم) هەموو

ئەمانە بەدیار دەیەخیُو تێکیان هەڵناکێشێ.

يبحث عنه في علم القراءات

نحو إدغام الدال في الضاد: ﴿فَقَدْ ضَلَّ﴾ وإدغام التاء في الثاء نحو: ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ﴾ وحفص عن عاصم يظهر ذلك كله.

# ئەو دوو پیتانەی لەیەکتر دوورن

## الحرفان المتباعدان

ئەو دوو پیتانەن کە لەیەکتر دوورن لە شوێنی دەرچوون و لە سیفەتەکاندا

وەکو: ﴿مَنْ ءَامَنَ-أَنْعَمْتَ-عَلَيْهِمْ - يُؤْمِنُونَ-تَشْكُرُونَ﴾

وحوکمەکەشیان بەدیار خستنە لە هەموو خوێندنەوەکاندا.

هما الحرفان المتباعدان في المخرج والصفات

نحو: ﴿مَنْ ءَامَنَ-أَنْعَمْتَ-عَلَيْهِمْ - يُؤْمِنُونَ-تَشْكُرُونَ﴾

وحكمهما الإظهار في كل القراءات.

# لامی پێ ناسین
## لام التعريف

ئەو لامە زەنەدارەیە (سکوندار) کە عەرەب لە پێشی ناوەکاندا دایدەنێ بۆ ناساندنیان وە لە پێش ئەم لامەدا (هەمزەیەکی لێکدانی لەسەر) دێتو ئەم هەمزەیەش بەبەردەوامی لە نووسیندا جێگرە، وە لەکاتی گەیاندنی واتە لەسەرەتادا نەبێت نامێنێ واتە ناخوێندرێتەوە.

وەکو: ﴿الْبَيْتَ - الْكِتَابُ - الْوَكِيلُ - وَالْفَجْرِ وَالْقُرْءَانِ﴾

هي لام ساكنة تجعلها العرب قبل الأسماء لتعريفها وتسبقها همزة وصل مفتوحة وتثبت هذه الهمزة في الخط دائماً وأما في النطق فتثبت في البدء فقط وتسقط في الوصل:

نحو: ﴿الْبَيْتَ - الْكِتَابُ - الْوَكِيلُ - وَالْفَجْرِ وَالْقُرْءَانِ﴾

**حاڵەتەکانی لامی پێ ناسین لەگەڵ پیتەکانی هیجای دوای خۆی**

**وضع لام التعريف مع حروف الهجاء بعدها**

| شەمسی | قەمری |
|---|---|
| لێکدەدرێ (تێکهەڵدەکێشرێ) | بەدیار دەخسترێ (لێکنادرێ) |
| شمسية | قمرية |
| (مدغمة) | (مظهرة) |

# لامی شەمسی

## اللام الشمسیه

عەربەکان لامی ناساندن تێکهەڵدەکێشن لەگەڵ ١٣ پیتی نزیك لە لام لە شوێنی دەرچوونیان وەکو: ﴿والشَّمْسَ- والسَّمَآءِ - الطَّوْلِ﴾

پیتەکانی شەمسی کۆکرایتەوە لە پیتەکانی یەکەمی وشەکانی ئەم بەیتە شیعریە:.

طِبْ ثُم صِلْ رِحْماً تَفُزْ ضِفْ ذا نِعَمْ
دَعْ سُوءَ ظَنٍّ زُرْ شَرِيفاً للكَرَم

تدغم العرب لام التعريف في ١٣ حرفاً مقارباً للام في المخرج.

نحو: ﴿والشَّمْسَ- والسَّمَآءِ - الطَّوْلِ﴾

الحروف الشمسية مجموعة في الحروف الأولى من كلمات البيت التالي:

طِبْ ثُم صِلْ رِحْماً تَفُزْ ضِفْ ذا نِعَمْ
دَعْ سُوءَ ظَنٍّ زُرْ شَرِيفاً للكَرَم

کەواتە پیتەکان بریتین لە:

ط، ث، ص، ر، ت، ض، ذ، ن، د، س، ظ، ز، ش، ل.

لێرەدەبینین (١٤) پیتە، چونکە (ل) تێدایە کە پیتێکی هاوشێوەی خۆیەتی.

# لامی قەمری

## اللام القمريه

عەربەکان لامی ناساندن بەدیار دەخەن لەگەڵ ١٤ پیت کە کۆکرایتەوە لەم رستەیە :

**( أبغ حجك وخف عقيمه )**

ئەم رستەیە واتە : حەجی خۆت جێبەجێ بکەو بترسە لەوەی بەتاڵ ببێتەوە بێ بەروو بووم و وەجاغ کوربێت.

ئەوەش لەبەر دووری شوێنی دەرچوونی لامە لەم پیتانە

وەکو: ﴿ٱلْقَمَرَ - ٱلْأَرْضَ - ٱلْحَجَّ - ٱلْجِبَالُ - ٱلْبَيْتَ﴾

تظهر العرب لام التعريف عند ١٤ حرفاً مجموعة في الجملة :

**( ابغ حجك وخف عقيمه )**

وذلك لبعد مخرج اللام عن مخارج تلك الحروف

نحو: ﴿ٱلْقَمَرَ - ٱلْأَرْضَ - ٱلْحَجَّ - ٱلْجِبَالُ - ٱلْبَيْتَ﴾

# حوکمەکانی میمی سکوندار
## أحكام الـميم الساكنة

**یەکەم : تێکهەڵکشانی لێوی**

**مْ + م جووڵەدار = مّ ( مینگەکە : لەو پەڕی کاملی دەبێت )**

**نموونە :** ﴿ لَكُم مَّا - مَّا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٍ ﴾

**أولاً : الأدغام الشفوي**

**مْ + م متحركة = مّ ( الغنة : أكمل ما تكون )**

**مثال:** ﴿ لَكُم مَّا - مَّا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٍ ﴾

**دووەم : شاردنەوەی لێوی**

**مْ + ب ( مینگەکە : کامل و تەواوە )**

**نموونە :** ﴿أَم بِهِۦ جِنَّةٌۢ - تَرۡمِيهِم بِحِجَارَةٍ ﴾

**ثانيا : الإخفاء الشفوي**

**مْ + ب ( الغنة : كاملة ) مثال:**

﴿أَم بِهِۦ جِنَّةٌۢ - تَرۡمِيهِم بِحِجَارَةٍ ﴾

**سێیەم: بەدیارخستنی لێوی**

**مْ + پیتەکانی تر ( مینگەکە : تەواو نیە )**

**نموونە :** ﴿أَنذَرۡتُكُمۡ عَذَابًا - سَمۡكَهَا ﴾

**ثالثاً : الإظهار الشفوي**

**مْ + باقي الحروف ( الغنة : ناقصة )**

**مثال:** ﴿أَنذَرۡتُكُمۡ عَذَابًا - سَمۡكَهَا ﴾

# حوکمەکانی میمی سکوندار
# أحكام الميم الساكنة

**ئاگاداری**
**تنبيــه**

**پێویستە ئاگاداربین لەوەی کەنابێ میم بشارینەوە لەکاتی گەیشتنی بە پیتی( فـاء ) و( واو ) چونکە زمان بەرەو شاردنەوە دەچـێت بـەهۆی ئـەوەی شوێنی دەرچوونی لەگەڵ واو یەکەو لەگەڵ ( فاء ) نزیکە.**

**نموونە :** ﴿هُمْ فِيهَا﴾ ﴿هُمْ وَالْغَاوُونَ﴾

**يجب الانتباه إلى عدم إخفاء الـميم عنـد حـرفي الفـاء والـواو فـإن اللـسان يـسبق إلى الاخفاء بسبب اتحاد المخرج مع الواو وقربه من الفاء.**

**مثال:** ﴿هُمْ فِيهَا﴾ ﴿هُمْ وَالْغَاوُونَ﴾

**تێبینی**
**مـلاحظة**

**لە زانستی تەجوید شتێك نیە پێی بگوترێ زۆر بەدیارخستن چـونکە بەدیارخستن هەر بەدیارخستنە.**

**لا يوجد شيء في التجويد اسمه اشد الإظهار فالإظهار هو الإظهار.**

# چەند پێناسەیەکی گرنگ
# تعاريف هامة

**مینگە : الغنة.**

: ئەو دەنگەیە کە لەبۆشایی لووت دەردەچێ. وە لەگەڵ نوون و میم دایە بەهەر شێوازێك بن، وە درێژەی ماوەکەی جیاوازە بە جیاوازی حوکمەکەی..

هي صوت يخرج من التجويف الأنفي ( الخيشوم ). ويصاحب في اللغة العربية حرفي النون والميم مهما كان وضعها ويختلف طول زمنه باختلاف الحكم.

**بەدیار خستن: الإظهار**

دەرچوونی پیت لە شوێنی خۆی بەبێ زیادە لە مینگە.

إخراج الحرف من مخرجه من غير زيادة في الغنة

# چەند پێناسەیەکی گرنگ
# تعاريف هامة

## تێکهەڵکشان
## الإدغام

: گەیاندنی پیتێکی سکوندار بـە پیتێکـی جووڵـەدار بـە شێوەیەك ببنە یەك پیتی تووندکراو لە رەگەزی پیتی دووەم کە بەیەك جووڵەو بڵندبوونـەوە شـوێنی دەرچـوونی بڵنـد دەبێت.

إيصال حرف ساكن بحرف متحرك بحيث يصيران حرفاً واحداً مشدداً من جنس الثاني يرتفع عنهما المخرج إرتفاعه واحدةً

## شاردنەوە
## ألإخفاء

بریتیە لە دەربڕینی پیت بە شێوازێك لە نێوان دیارخستن و تێکهەڵکشان بەبێ تووند کردن لەگەڵ مانەوەی مینگە لـە پیتی یەکەم.

هو نطقٌ بحرفٍ بصفة بين الإظهار والإدغام عارٍ عن التشديد مع بقاء الغنة في الحرف الأول.

# ماوەی مینگەکـــــان
# أزمنة الغنـــن

پلەی یەکەم: بەکاملترین و تەواوتر دەبێ:

*لە نون و میم ی تووندکراو.

نموونە: إنَّ

*لە نون و میمی تێکهەڵکێشراو لەگەڵ پیتی دوای خۆیان.

نموونە: مِمّا ، لهُمْ ما ، مَنْ يَّساء

المرتبة الأولى: أكمل ما تكون:

*في النون والميم المشددتين.

*في النون والميم المدغمتين.

پلەی دووەم: کامل تەواو: لە نون و میمی شاراوە.

نموونە: أنْتُم، ينْقلِب ، مَالَهُمْ بهِ

المرتبة الثانية: الكاملة : في النون والميم المخفاتين.

پلەی سێ یەم: ناتەواو: لە نون و میمی سکوندارو دیار

نموونە: يَنْهَونَ، ينْحِتون، أنْعَمْتَ

المرتبة الثالثة: الكاملة : في النون والميم الساكنتين المظهرتين.

پلەی چوارەم: ناتواوترین بە کەم و کورێ دەبێ: لە نون و میمی جوولەدار.

نموونە: مِنَ ، الرَّحمنِ الرحيمِ

المرتبة الرابعة: أنقص ما تكون : في النون والميم المتحركتين.

# حوكمەكانی نونی سكوندارو تەنوین
# أحكام النون الساكنة والتنوين

## دیارخستن / الإظهار

: نْ + پیتەكانی گەرو قورگ: (أ ، هـ ، ع، ح، غ، خ)
مینگە: ناتەواوە
:نْ + حروف الحلق: (أ ، هـ ، ع، ح، غ، خ)
الغنة: ناقصة.

## هەڵگەران / القلب

: نْ + ب = م شاراوە
مینگە: تەواو كامڵە
: نْ + ب = م مخفاة
الغنة :كاملة.

## تێكهەڵكشان / الإدغام

نْ + یرملون

بە مینگە: نْ+ یومن مینگە: لەوپەڕی كامڵی دەبێ
بغنــــە: نْ+ یومن الغنة: ناقصة.

بێ مینگە: نْ + (ل، ر) مینگە: مینگە نیە
بلا غنە: نْ + (ل، ر) الغنة: لا یوجد

## شاردنەوە / الإخفاء

: نْ + پیتەكانی تر: مینگە: كامڵ تەواوە
(ت، ث، ج، د ، ذ، ز، س، ش، ص، ض، ط، ف، ق، ك)
:نْ + باقي الحروف: الغنة : كاملة
(ت، ث، ج، د ، ذ، ز، س، ش، ص، ض، ط، ف، ق، ك)

# بەدیار خستنی نونی سکوندارو تەنوین
# إظهار النون الساكنة والتنوين

**نونی سکوندار**
: بریتیە لەو نوونەی جولەدار نیە کە جێگیرە لە دەربڕین و وەستان.

**النون الساكنة**
: هي النون غير المتحركة التي تثبت لفظاً ووقفاً.

**تەنوین**
( ً ٍ ٌ )
**التنوين**
: بریتیە لە نونێکی سکوندار کە عەرەب لە کۆتایی ناوەکان دایدەنێ بەدەربڕین و خوێندنەوە نەك نووسین، وە لە گەیاندن و بەردەوام بوون نەك لەوەستان، وە نیشانەکەشی لە نووسیندا دووبارە بوونەوەی جوولیە، وەك: . ( بيتٌ ، بيتٍ ، بيتاً )
: هو نون ساكنة تلحقها العرب آخر الاسماء لفظاً لا خطاً ووصلا لا وقفاً وعلامته في الخط مضاعفة الحركة.
نحو ( بيتٌ ، بيتٍ ، بيتاً )

**بەدیارخستن**
**الإظهار**
: نوونی سکوندارو تەنوین بەدیار دەکەوێ ئەگەر لە دوا یان پیتێك هات لە شەش پیتەکانی گەروو، "قورگ"، ( لەگەڵ مانەوەی مینگەیەکی ناتەواو ).
: تظهر النون الساكنة والتنوين إذا أتى بعدهما حرف من أحرف الحلق الستة ( مع المحافظة على غنة ناقصة ).

# بەدیار خستنی نونی سکوندارو تەنوین
# إظهار النون الساكنة والتنوين

**پیتەکانی :** أ، هـ ، ع، ح، غ، خ.
**حروفه :** أ، هـ ، ع ، ح، غ، خ.

**نموونة( أمثلة ) : أ :**﴿ مِنْ أَحَدٍ –وَيَنْـَٔوْنَ –عَذَابًا أَلِيمًا ﴾

**هـ :**﴿ إِنْ هَـٰذَآ –يَنْهَىٰ – مَّهِينٍ هَمَّازٍ – وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ﴾

**ع :**﴿ مَّـنْ عَمِلَ –أَنْعَمْتَ –حَكِيمًا عَلِيمًا ﴾

**ح :**﴿ مَّـنْ حَكِيمٍ –يَنْحِتُونَ – عَلِيمًا حَكِيمًا ﴾

**غ :**﴿ مِنْ غَيْرِ –فَسَيُنْغِضُونَ –أَجْرٌ غَيْرُ﴾

**خ :**﴿ مَّـنْ خَيْرٍ ذَرَّةٍ خَيْرًا ﴾ ﴿وَٱلْمُنْخَنِقَةُ﴾

**نیشانەی بەدیارخستن لە ڕێککاری پەڕاوی قورئاندا :**
**علامة الإظهار في ضبط المصحف**

**-نیشانەی بەدیارخستنی نوونی سکونکدار بریتیە لە دانانی سەرکی خا بەبێ خاڵ ئەبەم بەم شێوەیە ( ْ )لەسەر نوونەکە، ئەوەش ئارەو ڕەمزی سکونە( زەنە )لەسەری.**

**-علامة إظهار النون الساكنة هي وضع رأس الخاء من غير نقطة هكذا( ْ ).**

**-نیشانەی بەدیار خستنی تەنوین بریتیەلە سەریەکدانانی دوو جووڵە لەسەر یەکتر ئە بەم شێوەیە : ( ـً ) ( ـٌ ) ( ـٍ )**

**-علامة إظهار التنوين هو تراكب الحركتين فوق بعضهما هكذا :**
**: ( ـً ) ( ـٌ ) ( ـٍ )**

# تێکهەڵکشانی نوونی سکوندارو تەنوین
# إدغام النون الساكنة والتنوين

تێکهەڵکشان: نوونی سکوندارو تەنوین تێکهەڵکێشدەکرێ ئەگەر لە دوایان هات پیتێك لە پیتەکانی تێکهەڵکێشان کە بریتیە لەم پیتانە: ( يرملون )

الادغام : تدغم النون الساكنة والتنوين إذا أتى بعدهما حرف من أحرف الإدغام وهي:

پیتەکانی( حروفه ) : يرملون:

بەشەکانی: ١-تێهەڵکێشانی بە مینگە: کە چوار پیتی هەیە: يومن.

٢-تێکهەڵکشانی بێ مینگەیی: دوو پیتی هەیە: ل، ر.

أقسامه: ١-إدغام بغنة: وله أربعة أحرف: حروفه : يومن.

٢-إدغام بلا غنة: وله حرفان : ل، ر.

# تێکهەڵکشانی نونی سکوندارو تەنوین
# إدغام النون الساكنة والتنوين

**نموونە( أمثلة )**

**١-تێکهەڵکشانی بە مینگە**

**الإدغام بغنة :**

ي: ﴿مَن يَشْـتَرِى- حِسَابـًا يَسِيرًا﴾

و: ﴿مِن وَلِيٍّ - عِجَافٌ وَسَبْـعَ﴾

م: ﴿وَإِن مِّـن شَـىْءٍ -حَبَّـةٍ مِّـن﴾

ن: ﴿لَن نُّؤْمِنَ -يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ﴾

**٢-تێکهەڵکشانی بێ مینگە :**

**الإدغام بلا غنة:** ل: ﴿كَأَن لَّـمْ -عَدُوٌّ لِّـي﴾

ر: ﴿مِّـن رَّبِّ - غَفُورًا رَّحِيمًا﴾

# تێکهەڵکشانی نوونی سکوندارو تەنوین(دووجووڵە)

# إدغام النون الساكنة والتنوين

**نیشانەی تێکهەڵکشان لە رێککاری پەراوی قورئاندا**

**علامة الإدغام في ضبط المصحف:**

**-نیشانەی تێکهەڵکێشانی کامڵو تەواو بۆ نونی سکوندار ئەوەیە کە سکونکەی لێ بکرێتەوەو نەمێنێو پیتی دوای خۆی توونو بکرێت (شەدەدار بکرێت) ئەوەش ئەگەر هاتوو پیتی دووەم(نون یان میم یان لام یان را )بێت.**

-علامة الإدغام الكامل للنون الساكنة هي تجريدها من السكون مع تشديد الحرف التالي إذا كان (نوناً أو ميماً أو لاماً أو راءً).

**-نیشانەی تێکهەڵکشیانی ناتەواوی نوونی سکوندار ئەوەیە کە سکونەکەی لێ لابدرێ وە پیتی دوای خۆی توونو شەدەدار نەکرێت ئەگەر پیتی دووم (یاء یان واو بێت).**

-علامة الإدغام الناقص للنون الساكنة هي تجريدها من السكون مع عدم تشديد الحرف التالي إذا كان (ياءً أو واواً).

**-نیشانەی تێکهەڵکشانی تەواوی تەنوین (دوو جوڵە) ئەوە یەکە دوو جوڵە کە (لەسەر یان لەبەر یان لەژێر) بەدوای یەکتر دابێت، لەگەڵ توونکردنی پیتی دووەم ئەگەر هاتوو پیتی دووەم (نون یان میم یان لام یان را )بێت.**

-علامة الإدغام الكامل للتنوين هي تتابع الحركتين مع تشديد الحرف التالي إذا كان (نوناً أو ميماً أو لاماً أو راءً).

**-نیشانەی تێکهەڵکشانی ناتەواو بۆ تەنوین ئەوەیە کە دوو جوڵەکە بەدوای یەکتردابێت لەگەڵ توونو نەکردنی پیتی دوای خۆی ئەگەر (یاء یان واو )بێت بەم شێوەیە:**

-(ـــَـــً) (ـــٌـــ) (ـــٍـــ)

-علامة الإدغام الناقص للتنوين هي تتابع الحركتين مع عدم تشديد الحرف التالي إذا كان (ياءً أو واواً) ويكون تتابع الحركتين هكذا:

-(ـــَـــً) (ـــٌـــ) (ـــٍـــ)

# تێکهەڵکێشانی نونی سکوندارو تەنوین
# إدغام النون الساكنة والتنوين

ئاگاداری:

نونی سکوندار لەگەڵ (واو، یاء) تێکەڵناکێشرێ ئەگەر بەیەکەوە لەیەك ووشەدابوون. وەکو:

﴿ قِنْوَانٌ - صِنْوَانٍ - ٱلدُّنْيَا - بُنْيَٰنٌ ﴾

تنبيه:

لا تدغم النون الساكنة في الواو والياء إذا اجتمعا في كلمة واحدة مثال:

﴿ قِنْوَانٌ - صِنْوَانٍ - ٱلدُّنْيَا - بُنْيَٰنٌ ﴾

حاڵو باری نوونی سکوندار بەهەردوویەش[1] لە حاڵەتی تێکهەڵکێشانی بەهەردوو جۆری

وضع النون الساكنة بجزأيها حالة الادغام بنوعيه

| | بەشی زمانی<br>الجزء اللساني | بەشی بۆشایی لووت | نموونە<br>مثال |
|---|---|---|---|
| تێکهەڵکشانی بە مینگە<br>الإدغام بغنة | تێکهەڵکێشراو<br>مدغم | دیار خراوە<br>مظهرة | ﴿ مِن وَلِيٍّ ﴾ |
| تێکهەڵکشانی بێ مینگە<br>الإدغام بلا غنة | تێکهەڵکێشراو<br>مدغم | تێهەڵکێشراوە<br>مدغمة | ﴿ مِن رَّبِّكَ ﴾ |

(١) تێبینی: پیتی (نون) دەبێ بە دوویەش لەکاتی دەرچوونی، بەشێکیان لە زمان دەردەچێ، بەشەکەی لە لووت دەردەچێ کە مینگەیە.

# هەڵگەڕانەوەی نونی سکوندارو تەنوین
# قلب النون الساكنة والتنوين

**هەڵگێڕانەوە:** نوونی سکوندارو تەنوین گەر بگات بە (باء) ئەوە هەڵدەگەڕێتەوەو دەگۆڕێ بە میمێکی شاراوەی بە مینگەی تەواو.

**القلب (الإقلاب):** تقلب النون الساكنة أو التنوين عند الباء ميماً مخفاة بغنة كاملة:

**أمثلة:**

﴿مَنْ بَخِلَ - بِذَنبِهِمْ - شَيْءٍ بَصِيرٌ﴾

# هەڵگەڕانەوەی نونی سکوندارو تەنوین
# قلب النون الساكنة والتنوين

**نيشانەی هەڵگێڕانەوە لەرێککاری پەڕاوی قورئاندا**
**علامات القلب في ضبط المصحف**

**-نيشانەی هەڵگەڕانەوەی نوونی سکوندار ئەوەیە کە میمێکی بچووك لەسەر نوون دادەنرێ لە جیاتی سکون ئە بەم شێوەیە (نۢ) وەکو:**

﴿ مِنۢ بَعدِ- أَنۢ بُورِكَ-أَنۢبِئْهُم﴾

**علامة قلب النون الساكنة هي وضع ميم صغيرة فوق النون بدل السكون هكذا(نۢ)* نحو:**

﴿ مِنۢ بَعدِ- أَنۢ بُورِكَ-أَنۢبِئْهُم﴾

**-نيشانەی هەڵگێرانەوەی تەنوین ئەوەیە کەمیمێکی بچووك لەجیاتی جوڵەی دووەم دابنرێ ئەوها:**
**-علامة قلب التنوين هي وضع ميم صغيرة بدل الحركة الثانية هكذا:**

( ـَـۢ ) ( ـُـۢ ) ( ـِـۢ )

**وەکو ( نحو):** ﴿جَزَآءَۢ بِمَا - سَمِيعُۢ بَصِيرٌ -شَيْءٍۢ بَصِيرٌ﴾

*تێبینی: ئەم میمە(م) پێی دەگوترێ میمی کورسی چونکە لە شێوەی کورسی یە.

# شاردنەوەی نونی سکوندار تەنوین
# اخفاء النون الساكنة والتنوين

## شاردنەوە
## الإخفاء

بریتیە لە دەربڕینی نونی سکوندار یان تەنوین بە شێوازو سیفەتێك لەنێوان بەدیارخستن و تێهەڵکێشان وە توونندی ( شەدە )ی تێدانیەو لەگەڵ مانەوەی مینگەی تەواو لە پیتی یەکەم دا، ئەوەش ئەگە رهاتوو یەکێك لە پازدە پیتەکانی شاردنەوەیان بەدوا دا هات.

النطق بالنون الساكنة أو التنوين على صفة بين الإظهار والإدغام عار عن التشديد مع بقاء الغنة الكاملة في الحرف الأول وذلك إذا جاء بعدهما أحد حروف الإخفاء الخمسة عشر.

**تێبینی** : دەبێ ئاگاداری بین :مینگە لە ( إخفاء ) بە گوێرەی پیتی دوای خۆی قەڵەویان لاواز دەکرێت، واتە ئەگەر پیتی دوای ( ن ) لە ( إخفاء ) پیتێکی قەڵەوبوو ئەوە مینگەکەش دەبێ قەڵەو بێت ئەگەرنا لاواز دەبێت. پیتە قەڵەوەکانی ( إخفاء ) ئەمانەن:

( ص، ض، ط، ظ، ق ) واتە پێنج پیتن، نموونە : ( مِن قَبل، يَنْصُرُ )

پیتە لاوازەکان لە ( إخفاء ) ئەمانەن: ( ت، ث، ج، د، ذ، ز، س، ش، ف ، ك ) واتە دە پیتن، نموونە : أنْتَ ، مِنْكُم

# شاردنەوەی نونی سکوندار و تەنوین
# اخفاء النون الساكنة والتنوين

**پیتەکانی شاردنەوە: ت، ث، ج، د، ذ، ز، س، ش، ص، ض، ط، ظ، ف، ق، ك.**

**ئەو پیتانە کۆکراینەوە لە یەکەمی ووشەکانی ئەم دێرە شیعرەی خوارەوە.**

**صف ذا ثنا كم جاد شخص قد سما**

**دم طيباً زد في تقى ضع ظالما**

**حروفه: ت، ث، ج، د، ذ، ز، س، ش، ص، ض، ط، ظ، ف، ق، ك: وهي مجموعة في أوائل كلمات البيت التالي:**

**صف ذا ثنا كم جاد شخص قد سما**

**دم طيباً زد في تقى ضع ظالما**

**نموونەکان:**

**أمثلة:**

﴿ أَنفُسكُم- تُنذِرْهُمْ - مِنكُمْ- الإِنسَانُ- مَنصُورًا- مِن دُونِ -أن كَانَ-مِن قَبْلُ -مِن شَيْءٍ -مَآءًثَجَّاجًا -شَيْءٍ شَهِيدٌ -تَبَعًا فَهَلْ - حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا-كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ ﴾

# شاردنەوەی نونی سکوندار و تەنوین
# اخفاء النون الساكنة والتنوين

| | بەشی زمانی<br>الجزء اللساني | بەشی بۆشایی لووت<br>الجزء الخيشومي | تووندکردن( شەددەدارکردن )<br>التشديد |
|---|---|---|---|
| بەدیارخستن<br>الإظهار | هەیە<br>موجود | هەیە<br>موجود | توونده ناكرێ ( شەددەی نیە )<br>عار عن التشديد |
| شاردنەوە<br>الإخفاء | نیە<br>معدوم | هەیە<br>موجود | توونده ناكرێ ( شەددەی نیە )<br>عار عن التشديد |
| تێکهەڵکشانی بێ مینگە<br>الإدغام بلا غنة | نیە<br>معدوم | نیە<br>معدوم | لەگەڵ تووندکردن ( شەددەی هەیە )<br>مع التشديد |

# نیشانەی شاردنەوە لە ڕێککاری پەڕاوی قورئان
# علامة الإخفاء في ضبط المصحف

❖ نیشانەی شاردنەوەی نونی سکوندار لە ڕێککاری پەڕاوی قورئانـدا بریتیـە لە لێکردنەوەی سکون لە نوونی سکوندار لەگەڵ ئـەوەی پـیتی دوای خـۆی توند ناکرێ.

علامة إخفاء النون الساكنة في ضبط المصحف هي تجريد النون الساكنة من السكون مع عدم تشديد الحرف التالي.

وەکو( نحو): ﴿ مِــن دُونِ –أَن كَانَ–مِن قَبْــلُ﴾

❖ نیشانەی شاردنەوەی تەنوین لە ڕێککاری پـەڕاوی قورئانـدا بریتیـە لـە بەدوای یەکداهاتنی دوو جوڵە کە لەگەڵ تووند نەکردنی پیتی دوای خۆی.

علامة إخفاء التنوين في ضبط المصحف هي تتابع الحركتين مع عدم تشديد الحرف التالي.

وەکو( نحو): ﴿ مَآءً ثَجَّاجًا –شَيْءٍ شَهِيدٌ –عَيْــنٌ جارِيَةٌ﴾

## ئەوەی کە پێویستە بکرێ لە کاتی دەربڕینی نونی شاراوە
## المطلوب علمه عند نطق النون المخفاة

١) ئامادەکردنی دەم لەسەر شوێنی دەرچوونی پیتی دوای خۆی.
تهيئة الفم على مخرج الحرف التالي.

٢) دەربڕینی مینگەیەکی تەواو لە بۆشایی لووت.
نطق غنة كاملة من الخيشوم.

٣) دەربڕینی دەنگێکی کەم لەدەمدا بەهۆی دانەخرانی شوێن دەرچوونی نون (بەشی زمانی)
نطق صويت من الفم بسبب عدم انغلاق مخرج النون (الجزء اللساني)

**ئاگاداری**
**تنبيه**

- دەنگی نونی شاراوە یان تەنوینی شاراوە قەڵەو دەبێت ئەگەر لەدوای خۆی پیتێکی قەڵەو هات.
  يكون صوت النون المخفاة أو التنوين مفخماً إن جاء بعده حرف مفخم
  وەکو( نحو ): ﴿مِن قَبۡلُ - مَنصُورًا﴾
- دەنگی نونی شاراوە یان تەنوینی شاراوە باریك و لاواز دەبێت گەر دوای خۆی پیتێکی تەنك و لاواز هات.
  يكون صوت النون المخفاة أو التنوين مرققاً إن جاء بعده حرف مرقق نحو:
  وەکو( نحو ) ﴿أَن كَانَ - ٱلۡإِنسَٰنُ﴾

# پێناسە
# تعريف

**پێناسەی مەد**

**تعريف المد**

**لە زمانەوایند: زیادەو درێژکردنە**

**لە زاراوەدا: بریتیە لە درێژکردنەوەی دەنگ بە پیتێك لە پیتەکانی درێژکردنەوەو ئاسانی (المد اللین) یان دوو پیتی ئاسانی.**

**لغة: الزيادة والتطويل.**

**اصطلاحا: هو إطالة الصوت بحرف من حروف المد واللين أو حرفي اللين.**

**پیتەکانی مەدو لین**

**حروف المد واللين**

**بریتیە لە (ئەلف و واو و یاء)ی سکوندار لە رەگەزی پێش خۆی بێت وەکو:**

**هي الألف والواو والياء السواكن المجانس لها ما قبلها (نحو):**

﴿بِمَآ - عَلَىٰ - دَّخَلُواْ - يَدۡعُواْ - وَنَسۡقِي - وَإِيَّاكُمۡ - يَخَافُونَ - يَسُومُهُمۡ - فِيكُمۡ - قَمِيصِهِۦ﴾

**دوو پیتی ئاسانی**

**حرفا اللين**

**بریتین لە (واو و یاء) سکوندار کە پێشیان لەسەر بێت وەك:**

**هما الواو والياو الساكنتان المفتوح ما قبلهما .**

**وەکو( نحو ):**

﴿قَوۡلٌ - يَوۡمِ - قُرَيۡشٍ - وَٱلصَّيۡفِ - وَٱلَّيۡلِ﴾

# جۆرەكانی درێژكردنەوە
# أنواع الـمدود



# یەکەم- مەدی ئاسایی
# أولاً-المد الطبيعي

## پێناسە
## تعريف

**بریتیە لەو درێژکردنەوە ( مەدە )ی کە خودی پیتەکە بەو نەبێت دروست نابێت و درێژکردنەوەکەش هیچ هۆکارێکی* نیە.**

**وەکو:**

﴿بِمَآ–عَلَىٰ–دَّخَلُواْ–يَدْعُواْ–وَنَسْـــقِى–وَإِيَّاكُمْ–يَخَافُونَ يَسُومُهُمْ–فِيكُمْ– قَمِيصِهِۦ﴾

**هو المد الذي لا تقوم ذات الحرف إلا به ولا يتوقف على سبب.**

**نحو:**

﴿بِمَآ–عَلَىٰ–دَّخَلُواْ–يَدْعُواْ–وَنَسْـــقِى–وَإِيَّاكُمْ–يَخَافُونَ يَسُومُهُمْ–فِيكُمْ– قَمِيصِهِۦ﴾

*هۆکاری درێژکردنەوە( مد ) بریتیە لە سکون و هەمزە، گەر یەکێك لەم دووانە بەدوای پیتی ( مەد ) دا هات ئەوا درێژدەکرێتەوە.

# پێوەری ماوەی درێژکردنەوەکان ( مەدەکان )
# قياس أزمنة المدود

ماوەی مەددەکان دەپێورێ بە جووڵەکان ( سەرو بۆرو ژێر َ ُ ِ )

تقاس أزمنه المدود بالحركات

جووڵە: بریتیە لە خایاندنی ئەو ماوەی کە پێویستە بۆ دەربڕینی پیتێکی جووڵاو، لەسەر بێت یان لەبەر یان لە ژێر:

خایاندنی ماوەی کاتی قَ= خایاندنی ماوەی کاتی قُ=خایاندنی ماوەی کاتی قِ

الحركة: هي الفترة الزمنية اللازمة للنطق بحرف متحرك مفتوح أو مضموم أو مكسور: زمن قَ =زمن قُ = قِ.

کەواتە لەسەر ئەوەی گوتمان ئەوە بیناتدەنرێ کە دووجووڵە: بریتیە لەو ماوەی کە پێویستە بخایەنێت بۆ دەربڕینی دوو پیتی جووڵاوی بەدوای یەکداهاتوو.

وعليه فالحركتان: هي الفترة الزمنية اللازمة للنطق بحرفين متحركين متتاليين.

ئەندازەی مەددی ئاسایی: مەددی ئاسایی درێژ دەکرێتەوە بە ئەندازەی دوو جووڵە بۆ نموونە:

ماوەی دەربڕینی قا =ماوەی دەربڕینی قَ قَ *

ماوەی ما =ماوەی مو = ماوەی می

مقدار المد الطبيعي: يمد المد الطبيعي بمقدار حركتين فمثلاً:

زمن النطق بـ قا = زمن النطق قَ قَ.

زمن ما = زمن مو = زمن مي.

تێبینی: * لێرەدا مەبەست پێ ئەوەیە کە ئەلفی (قا)=قَ قَ ، ئەوەك هەردوو پیتی (ق) بۆیە دەبوایە نموونەکە وا بهێنراباوە کە قا=قَ قَ قَ. چونکە لە پێش (ئەلیف) و(ق) هەیە، وە ئەلفەکەش دوو (ق) کەواتە دەکاتە سێ (ق)

# پلەی ماوەکانی مەددەکان
# مراتب أزمنة الـمدود

**ماوەی مەددەکان پێنج پلەیان هەیە**

لأزمنة المدود خمسة مراتب

| | |
|---|---|
| ١- کورت | ئەندازەکەی دوو جووڵەیە. |
| ٢- تۆزێك لەسەروی کورت | ئەندازەکەی (٣) جووڵەیە. |
| ٣- ناوەند | ئەندازەکەی (٤) جووڵەیە. |
| ٤- تۆزێك لەسەروی ناوەند | ئەندازەکەی (٥) جووڵەیە. |
| ٥- درێژیان تێرکردن | ئەندازەکەی (٦) جووڵەیە. |

| | |
|---|---|
| ١- القصر: | ومقداره حركتان. |
| ٢- فويق القصر: | ومقداره (٣) حركات. |
| ٣- التوسط: | ومقداره (٤) حركات. |
| ٤- فويق التوسط: | ومقداره (٥) حركات. |
| ٥- الطول أو الإشباع | ومقداره (٦) حركات. |

# دووەم-درێژکردنەوەی لە جیاتی
# ثانياً – مد البدل

## پێناسە
## تعريف

**بریتیە لە هەموو هەمزەیەکی درێژکراو وە حاڵەتێکی تایبەتیە لە مەددی ئاسایی و بە ئەندازەی دوو جووڵە درێژ دەکرێتەوە.**

**هو كل همز ممدود. وهو حالة خاصة من الطبيعي. ويمد بمقدار حركتين.**

**نحو:**

﴿ ءَامَنُواْ –أُوتُواْ–إِيمَـٰنًا ﴾

﴿يُرَآءُونَ–وَمَا تَشَآءُونَ –وَجَآءُو﴾

# سێیەم: مەددی قەرەبوو
# ثالثاً – مد العوض

## پێناسە
## تعریف

**بریتیە لە قەرەبوو کردنەوەی دوو لەسەر (تنوین نصب-اً-) لە حاڵەتی وەستان بەئەلیفێك کە بەئەندازەی دوو جووڵە درێژدەکرێتەوە، وەئەویش لەگەڵ مەددی ئاسایی دادەنرێ.**

**هو التعویض عن تنوین النصب حالة الوقف بالف تمد بمقدار حرکتین، ویلحق بالمد الطبیعي.**

**وەکو: نحو:**

﴿ عَلِيمــاً-عَلِيما ﴾

﴿ كَثِيراً- كَثِيرا ﴾

﴿أَحَداً-أَحَدا ﴾

﴿ رُشْــداً- رُشْــدا﴾

# ئاگاداری
# تنبيه

١-ئەوەی کە جیادەکرێتەوە لەمەدی قەرەبوو( هاء ) مێینەیە، کە وەستان لەسەری بەسکون دەبێت:

وەکو: ﴿ وَشَجَرَةً - وشَجَرَهْ ﴾

﴿ جَنَّةٍ - جَنَّـــة ﴾

-يستثنى من مد العوض هاء التانيث فيوقف عليها بالسكون.

( نحو ):

﴿ وَشَجَرَةً - وشَجَرَهْ ﴾

﴿ جَنَّةٍ - جَنَّـــة ﴾

٢-وەستان لەسەر ئەم ووشـانە ﴿ مَآءً - دُعَآءً -شَيْئـــاً ﴾ لـە مـەددی قەرەبووە نەوەك مەددی لەجیاتی چونکە ئەلیفەکەی لەناکاو پەیدادەبێت بەهۆی وەستان.

-الوقف على نحو : ﴿ مَآءً - دُعَآءً -شَيْئـــاً ﴾ هو من قبيل مد العوض وليس مد بدل لأن ألفه عارضة بسبب الوقف.

٣-ئەگەر دوو لەسەر ( آ )لەسەر هەمزەی کۆتایی ولا پەڕ بوو وەکو: ﴿ بِنَآءً ﴾ ئەوە لەسەری دەوەستین : ﴿ بِنَآءا ﴾

-إذا جاء تنوين النصب على همزة متطرفة مثل : .

﴿ بِنَآءً ﴾ نقف عليه : ﴿ بِنَآءا ﴾

# چوارەم –درێژکردنەوەی (جیاکراو)
# رابعاً – المد المنفصل

## پێناسە
## تعريف

بریتیەلەوەی کە پیتی درێژکردنەوە لە کۆتایی ووشەی یەکەم بێت وە هەمزەی (قطع) لەیەکەمی ووشەی دوای خۆی بێت. وەکو:

﴿ بِمَآ أُنزِلَ ﴾ ﴿قَالُوٓاْ ءَامَنَّا﴾ ﴿ وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ﴾

هو أن ياتي حرف المد آخر الكلمة الأولى وهمزة القطع في أول الكلمة التي تليها.

نحو: ﴿ بِمَآ أُنزِلَ ﴾ ﴿قَالُوٓاْ ءَامَنَّا﴾ ﴿ وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ﴾

## ئەندازەی مەددی جیاکراو
### مقدار المد المنفصل

*جووڵە: بریتیە لە خایاندنی ماوەی پێویست بۆ دەربڕینی پیتێکی جووڵاو.
جیاکراو درێژ دەکرێتەوە (لە گێڕانەوەی حفص لە عاصم لە ڕێگەی شاطبية) بە ئەندازەی (٤) یان (٥) جووڵە یان بەئەندازەی دوو ئەلف یا دوو ئەلف و نیو.

-الحركة: هي الفترة الزمنية اللازمنة لنطق حرف متحرك.
يمد المنفصل (في رواية حفص عن عاصم من طريق الشاطبية) بمقدار (٤) أو(٥)حركات أو بمقدار ألفين أو ألفين ونصف.

*جیاکراو درێژ دەکرێتەوە (لە گێڕانەوەی حفص لە عاصم لە ڕێگەی طيبة النشر) مقدار: (٢) بە کورتی یان (٣) یان (٤) یان (٥) جووڵە.

-يمد المنفصل (في رواية حفص عن عاصم من طريق طيبة النشر) بمقدار: (٢) قصراً أو (٣) أو (٤) أو(٥) حركات)

# پێنجەم –مەددی بەیەکگەیشتوو
# خامسا-المد المتصل

## پێناسە
## تعریف

**بریتیەلەوەی کە پیتی مەددە و هەمزە لە دوای دابێت لەیەك ووشەدا ( ووشەکە خۆی ).**

**وەکو:** ﴿وَجَآءَكُمُ-سُـــــوٓءُ ٱلعَذَابِ –سِيٓءَ بِهِمۡ﴾

**هو أن ياتي حرف المد وبعده همزة في الكلمة نفسها.**

**نحو:** ﴿وَجَآءَكُمُ-سُـــــوٓءُ ٱلعَذَابِ – سِيٓءَ بِهِمۡ﴾

## ئەندازەی مەددی جیاکراو
## مقدار المد المتصل

***ئەم مەددەیە ( بەیەگەیشتوو ) درێژدەکرێتەوە( لە گێرانەوەی حفص لە عاصم لە رێگەی شاطبیة ) بە ئەندازەی (٤) یان (٥) جوولە یان بە ئەندازەی دوو ئەلیف یان دوو ئەلیف و نیو. .**

**-يمد المتصل ( برواية حفص عن عاصم من طريق الشاطبية ) بمقدار (٤) أو (٥) حركات أو بمقدار ألفين أو ألفين ونصف.**

***ئەم مەددەیە ( بەیەکگەیشتوو ) درێژدەبێتەوە ( لە گێرانەوەی حفص لە عاصم لە رێگەی طيبة النشر ) بە ئەندازەی (٤) یان (٥)یان (٦) جووڵە.**

**-يمد المتصل ( في رواية حفص عن عاصم من طريق طيبة النشر ) بمقدار : (٤) أو (٥) أو(٦) حركات )**

# الأوجه الجائزة في المنفصل والمتصل لحفص عن عاصم من طريق طيبة النشر

ئەو شێوانەی کە دروستە لە جیاکراو بە یەکگەشتوو لە گێڕانەوەی ( حفص لە عاصم ) لە ڕێگەی طيبة النشر.

وە لە بە لەیەکجاکردنەوەی ئەو حاڵەتانەی ( لەڕێگەی طيبة النشر ) ئەوە ( ١٢ )شێواز دێتە دەست بەڵام ئەوەی کە پێی دەخوێندرێتەوە ( ٧ ) شێوەیە کە بریتیە لە :

**ئەو شێوانەی دروستە لە جیاکراوو بەیەکگەیشتوو لە گێڕانەوەی حفص لە عاصم لەڕێگەی طيبة النشر**

وبتقاطع هذه الحالات ( من طريق طيبة النشر ) يحصل لدينا ١٢ وجه ولكن المقروء به ( ٧ ) أوجه وهي :

**الأوجـــه الجـــائزة في المنفـــصل والمتـــصل لحفـــص عـــن عاصـــم مـــن طريـــق طيبـــة النـــشر**

| جیاکراو المنفصل | بەیەکگەیشتوو المتصل |
|---|---|
| ٢ | ٤ |
| ٢ | ٦ |
| ٣ | ٦ |

| جیاکراو المنفصل | بەیەکگەیشتوو المتصل |
|---|---|
| ٤ | ٤ |
| ٤ | ٦ |
| ٥ | ٥ |
| ٥ | ٦ |

# شەشەم —مەددی گەیاندن
# سادساً —مد الصلة

## پێناسە
## تعریف

**بریتیە لە گەیاندنی ڕاناوی هاء —کەکەسی سێیەمی تاك (تاکی نائامادەبووی نێرە) بە پیتی واو ئەگەر (هاء)ەکە لەبەربوو، وە بە یـاء ئەگەر لە ژێر بوو. بەو مەرجەی جوڵاو بێت لە مابەینی دوو جوڵاو بێت.**

**وەکو:** ﴿إِنَّهُۥ على رجعِهِۦ لقادر﴾

**هو صلة هاء الضمير —للمفرد الغائب المذكر- بواو إن كانت الهاء مضمومة وبياء إن كانت مكسورة. بشرط أن تكون متحركة وتقع بين متحركين.**

**نحو:** ﴿إِنَّهُۥ على رجعِهِۦ لقادر﴾

## بەشەکانی مەدی گەیاندن
**اقسام المد الصلة**

| گەیاندنی بچووك كە هیچ همزە لەدوای (هاء) نەبێت. صلة صغرى ليس بعد الهاء همزة | گەیاندنی گەورە كـە لـە دوای (هـاء) همـزە هەبێت صلة كبرى بعد الهاء همزة |
|---|---|
| ﴿مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ- وَأُمِّـــهِۦ وَأَبِيهِ﴾ دوو جوڵە | ﴿مَالَهُۥٓ أَخلَدَهُ- إِلَى طَعَامِهِۦٓ أَنَّا﴾ چوار و پێنج جوڵە |

# ئەندازەی مەدی گەیاندن
# مقدار مد الصلة

## ئەندازەی مەدی گەیاندنی بچووك
## مقدار مد الصله الصفری

گەیاندنی بچووك درێژ دەكرێتەوە بە ئەندازەی دوو جووڵەو لەگەڵ مەدی ئاسایی دادەنرێ: وەكو:
تمد الصلة الصفری وبمقدار حركتين وتلحق بالمد الطبيعي. نحو:

﴿ إِنَّهُۥ عَلَىٰ ﴾ دەخوێندرێتەوە (تقرأ): ﴿إنهو على﴾

﴿ رَجعِهِۦ لَقَادِرٌ ﴾ دەخوێندرێتەوە (تقرأ): ﴿رجعهي لقادر﴾

## ئەندازەی مەدی گەیاندنی گەورە

مەدی گەیاندنی گەورە درێژدەكرێتەوە بە ئەندازەی (٤) یان (٥) جووڵەو لەگەڵ مەدی جیاكراوە دادەنرێت: وەكو:

﴿ مَالَهُۥٓ أَخلَدَهُۥ ﴾ وەدەخوێندرێتەوە (تقرأ): ﴿مالهو أخلده﴾

﴿ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ أَنَّا ﴾ وەدەخوێندرێتەوە (تقرأ): ﴿إلى طعامهي أنا﴾

# ئاگاداری
# تنبيه

*مەدی گەیاندن تەنها لە ڕۆیشتن و بەیەکگەیاندن دەبێ جگە لەوە نابێ ئەگەر وەستاین ئەوە بە سکون دەوەستین.

-يكون مد الصلة في الوصل لا غير فاذا وقفنا نقف بالسكون.

نموونة( مثال ): ﴿مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ﴾ دەوەستین﴿ ماله ﴾

﴿ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ أَنَّا ﴾ دەوەستین﴿ إلى طعامه ﴾

*نە لەم نموونانەی خوارەوە وە نە لە هاوونەکانیان-مەدی گەیاندن نیە لەبەر نەبوونی مەرجەکە.

-ليس في الامثلة التالية-ولا ما يماثلها -مد صلة لانعدام الشرط:

١- ﴿ فِيهِ هُدًى ﴾ -چونکە پێشی سکونە-لأنها سبقت بساكن.

٢- ﴿ اسْمُهُ الْمَسِيحُ ﴾ -چونکە لەدوای خۆی سکونە-لان بعدها ساكن.

٣- ﴿ يَعلَمْهُ اللَّهُ﴾ -چونکە ( هاء )ی ڕاناو لە مابەینی دوو سکون هاتووە.لان هاء الضمير وقعت بين الساكنتين.

٤- ﴿ أَرجِهْ ﴾ -چونکە ( هاء )ی ڕاناو سکونداره. لان هاء الضمير ساكنة.

٥- ﴿ فَأَلْقِهْ ﴾ -چونکە ( هاء )ی ڕاناو سکونەداره.-لأن هاء الصغيرة ساكنة.

٦- ﴿لم يَنْتَهِ ﴾ -چونکە ئەم ( هاء )ە لە( هاء )ی ڕاناو نیە بەڵکەلە بنەڕەت و پێکهاتەی ( فعل )ەکەیە[1] -لان هذه الهاء ليست هاء الضمير بل هي من أصل الفعل

(١)بنچینەی ئەم ووشەیە (انتهى-ينتهي) ئەمیش لە (نهى-ينهي) وەرگیراوە.

# ئاگاداری
# تنبيه

**ئەوەی جودا دەكرێتەوە لە بنەمای مەدی گەیاندن دوو ووشەیە :**
**يستثنى من قاعدة مد الصلة كلمتان:**

***یەكەم: بنەمای ڕێسای لەسەر جێبەجێ نەبووەو كەچی مەدی گەیاندنی تێدایە كە بریتیە لە:** ﴿وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا﴾ **{الفرقان : ٦٩}**

**الاولى: لم تنطبق عليها القاعدة وفيها صلة وهي:**

﴿وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا﴾ **{الفرقان : ٦٩}**

***دووەم: ڕێساو بنەماكەی لەسەر جێبەجێ بووەو گەیاندنیشی تێدانیە كە بریتیە لە:**

﴿يَرۡضَهُ لَكُمۡ﴾ **{الزمر : ٧}**

**الثانية: لم تنطبق عليها القاعدة وفيها صلة وهي:**

﴿يَرۡضَهُ لَكُمۡ﴾ **{الزمر : ٧}**

# ئاگاداری
# تنبيه

*مەدی گەیاندنی لەگەڵ مەدی ئاسایی دادەنرێ چونکە:
-يعتبر مد الصلة الصغرى ملحقا بالمد الطبيعي لأن:

| ﴿ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ | ﴿إِنَّهُۥ , عَلَىٰ﴾ |
| --- | --- |
| واو جێگیرە لە نووسین و دەربڕین و ڕۆیشتن و وەستان<br>واو ثابتة خطا ولفظاً وصلاً ووقفاً | واو جێگیرە لە دەربڕین و ڕۆیشتن (نەوەستان) وە لێی جیادەبێتەوە لە نووسین و وەستان.<br>واو ثابتة لفظاً ووصلا وتفارقه خطاً ووقفاً |

*وە هەر لەبەر هەمان هۆکار مەدی گەیاندنی گەورە لەگەڵ مەدی جیاکراوە دادەنرێ
يعتبر مد الصلة الكبرى ملحقا بالمد المنفصل لنفس السبب:

| ﴿ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ﴾ | ﴿مَالَهُۥٓ أَخۡلَدَهُۥ﴾ |
| --- | --- |
| واو جێگیرە لە نووسین و دەربڕین و ڕۆیشتن و وەستان<br>واو ثابتة خطاً ولفظاً وصلاً ووقفاً | واو جێگیرە لە دەربڕین و ڕۆیشتن وەلێ جیادەبێتەوە لە نووسین و وەستان.<br>واو ثابتة لفظاً ووصلاً وتفارقه خطاً ووقفاً |

# حەوتەم-مەدی پەیوەست
# سابعاً -الـمد اللازم

## پێناسە
## تعریف

بریتیە لەوەی کە پیتی مەدی دێتن وە لە دوای ئەو پیتێکی سکوندار بێت کە سکونەکەی بنەڕەتی و هی خۆی بێت ( لە رۆیشتن و وەستان )

هو أن ياتي حرف المد وبعده حرف ساكن سكوناً أصلياً ( وصلاً ووقفاً ).

نحو:

﴿ٱلضَّآلِّينَ﴾ ﴿ءَآلْـَٔـٰنَ﴾ ﴿حامٓ﴾ ﴿نٓون﴾

## بەشەکانی مەدی پەیوەست
## اقسام الـمد اللازم

| پەیوەستی ووشەیی لازم كلمي | | پەیوەستی پیتی لازم حرفي | |
| --- | --- | --- | --- |
| سووك مخفف | قورس مثقل | سووك مخفف | قورس مثقل |
| ﴿ءَآلْـَٔـٰنَ﴾ | ﴿ٱلصَّآخَّةُ﴾ | حامٓ | طاسٓمٓيم |

**ئەندازەی مەدی پێویست**

**مقدار الـمد اللازم**

مەدی پەیوەست درێژدەکرێتەوە بەهەموو بەشەکانی بە ئەندازەی ( ٦ ) جووڵە یان بەئەندازەی سێ ئەلیف

يمد اللازم بكل أقسامه بمقدار ( ٦ ) حركات أو بمقدار ثلاث ألفات.



## پیتە پچڕاوەکان لە پەرتوکی خودای بەهێزو بەرێزو گەورە
## الحروف المقطعة في كتاب الله عز وجل

خودای پەروەردگار لە( ٢٩ ) سورەتی قورئانی پیرۆز بە پیتی بچڕاو دەستی پێ کردووە کە هەر خودا بەخۆی دەزانێ مانای تەواویان چیە. ئەوەی لەسەر ئێمە پێویستە ئەوەیە کە بڕوامان هەبێت ئەوانە ووشەی پیرۆزی خودای پەروەردگارن، وە چۆن هاتووە ئەو ها بیخوێنیەوە.

-ابتدأ الله عز وجل ( ٢٩ ) سورة في القرآن الكريم بحروف مقطعة الله أعلم بمعناها. حظنا منها الايمان أنها كلام الله وتلاوتها كما وردت.

ژمارەی پیتە پچڕاوەکان ( ١٤ ) پیتە کە کۆکراینەوە لەم دەستەواژەدا : (نصٌ حكيمٌ قطعاً لە سر). واتە : دەقێکی پڕ لە دانایی و کاربەجێ یە بێگومان نهێنیەکی هەیە.

عدد الحروف المقطعة ( ١٤ ) حرفا مجموعة في العبارة (نَصٌ حَكيمٌ قطْعاً لَهُ سِرّ).

ئەم ( ١٤ ) پیتە پچڕاوە لە قورئاندا بە ( ١٤ ) شێواز هاتووە کە بریتین لە :

جاءت الحروف المقطعة الأربعة عشرة في القرآن على ( ١٤ ) هيئة هي:

﴿حمٓ﴾ ﴿الٓمٓ﴾ ﴿الٓمٓصٓ﴾ ﴿الٓر﴾ ﴿كٓهيعٓصٓ﴾ ﴿الٓمٓر﴾ ﴿ طه﴾ ﴿طسٓمٓ﴾

﴿ طسٓ﴾ ﴿ يسٓ﴾ ﴿ صٓ﴾ ﴿ حم عٓسٓقٓ﴾ ﴿ قٓ ﴾ ﴿ نٓ ﴾

# ئەم درێژکردنەوانەی لە پیتە پێچراوەکاندا هەیە
# المدود الواقعة في الحروف المقطعة

**پیتە پچڕاوەکان بە گوێرەی ئەو مەدەی کە تێیدایە دەبن بە چوار کۆمەڵ (گروپ):**
**تقسم الحروف المقطعة من حيث المد الذي فيها إلى ٤ مجموعات: .**

**کۆمەڵەی یەکەم**
**المجموعه الاولی**

**پیتی (ئەلیف): هیچ مەدی تێدانیە چونکە پیتی مەدی تێدانیە.**

**حرف (ألِفْ) : لا مد فيها لعدم وجود حرف مد.**

**کۆمەڵەی دووەم**
**المجموعة الثانية**

**پیتەکانی (حَيٌّ طَهُرَ) : هەر یەکەیان بەدوو پیت دەخوێندرێتەوە کە دووەمیان پیتی مەدە. وە بە ئەندازەی دوو جووڵە بەمەدێکی ئاسایی درێژ دەکرێتەوە: ئەوها حَا، يَا، طا، هَا، رَا.**

**حروف (حَيٌّ طَهُرَ) : ينطق كل منها على حرفين ثانيهما حرف مد. ويمد بمقدار حركتين مداً طبيعياً هكذا: حَا، يَا، طا، هَا، رَا.**

## ئەم درێژکردنەوانەی لە پیتە پێچراوەکاندا هەیە
## المدود الواقعة في الحروف المقطعية

**کۆمەڵەی سێیەم**

پیتەکانی (سَنَقُصُّ لَكُمْ): هەریەك لەم پیتانە بەسێ پیت دەخوێندرێتەوە کە ناوەراستیان پیتی مەدە. وە بەئەندازەی (٦) جووڵە بەمەدی پێویست درێژدەکرێتەوە، ئاوەها:

سِينْ ، نُونْ ، قَافْ، صَادْ ، لَامْ ، كَافْ ، مِيمْ

**المجموعة الثالثة**

حروف (سَنَقُص لَكُمْ): ينطق كل منها على ثلاثة أحرف أوسطها حرف مد. يمد بمقدار ٦ حركات مداً لازماً هكذا:

سِينْ ، نُونْ ، قَافْ، صَادْ ، لَامْ ، كَافْ ، مِيمْ

**کۆمەڵەی چوارەم**

پیتەکانی (عَيْنْ) :بەسێ پیت دەردەبڕدرێ کە ناوەڕاستی پیتێکی ئاسان (لین) بەئەندازەی (٤) یان (٦) جووڵە درێژ دەکرێتەوە وە کو مەدی ئاسان ئەمەش لە ووتەی خودای بەرزو بالا کە دەفەرموێ: ﴿كهيعص﴾ ﴿حم عسق﴾

**المجموعة الرابعة**

حرف (عَيْنْ) : ينطق على ثلاثة أحرف أوسطها حرف لين. يمد بمقدار (٤) أو (٦) حركات ويلحق بمد اللين وذلك في قوله تعالى:

﴿كهيعص﴾ ﴿حم عسق﴾

# نۆیەم: مەدی سکونی نابنەڕەتی (تووشبوو بە سکون)
# ثامناً: المد العارض للسكون

## پێناسە
## تعريف

بریتیە لەوەی پیتی مەد بێ وە دوای ئەوە پیتێکی سکوندار بێت کە سکونەکەی لەناکاوە (نا بنەڕەتی یە) بەهۆی وەستان.

هو أن ياتي حرف المد وبعده حرف ساكن سكوناً عارضاً بسبب الوقوف:

نحو:

﴿ٱلۡبَيَانَ﴾ ﴿تَعۡلَمُونَ﴾ ﴿نَسۡتَعِينُ﴾

## ئەندازەی مەدی سکونی لەناکاو
## مقدار مد العارض للسكون

مەدی سکونی نابنەڕەتی بە ئەندازەی (٢) یان (٤) یان (٦) جولە درێژ دەکرێتەوە یان بەئەندازەی ئەلف یان دوو یان سێ ئەلف.

يمد العارض للسكون بمقدار (٢) أو (٤) أو (٦) حركات أو بمقدار ألف أو ألفين أو ثلاث ألفات.

نحو:

﴿تَعۡلَمُونَ﴾٢ ﴿تَعۡلَمُونَ﴾٤ ﴿تَعۡلَمُونَ﴾٦

**ئاگاداری**: ئەگەر قورئان خوێن دەستی کرد بە قورئان خوێندن بە یەکێك لەو سێ ئەندازانەی پێشوو بۆ مەدی سکونی لەناکاو ئەوە بەردەوام دەبێ لەسەر ئەم حاڵەتە تا کۆتایی قورئان خوێندنەکەی.

**تنبيه**: إذا ابتدأ القارىء تلاوته باحد المقادير الثلاث السابقة للمد العارض للسكون فانه يستمر عليه الى ان ينهى تلاوته.

# نۆیەم- مەدی ئاسان ( اللين )
# تاسعاً – مد اللين

## پێناسە
## تعريف

**بریتیە لەوەی پیتی (لین) بێت و لە دوای ئەو پیتێکی سکوندار بێت کە بەهۆی وەستانەوە لەناکاو سکونار بوو بێت.**

**هو أن ياتي حرف اللين وبعده حرف ساكن سكوناً عارضاً بسبب الوقف.**

**نحو:**

﴿وَلَا نَوْمٌ﴾ ﴿خَوْفٍ﴾ ﴿قُرَيْشٍ﴾ ﴿الْبَيْتِ﴾

## ئەندازەی مەدی لین:
## مقدار مد اللين

**ئەندازەی مەدای لین: درێژدەکرێتەوە بەئەندازەی (٢) یان (٤) یان (٦) جووڵە یان بەئەندازەی ئەلفێك یان دوو ئەلف یان سێ ئەلف.**

**يمد اللين بمقدار (٢) أو (٤) أو (٦) حركات أو بمقدار ألف أو ألفين أو ثلاث ألفات.**

**نحو:**

﴿قُرَيْشٍ -قُرَيْشٍ -قُرَيْشٍ﴾

# ئەندازەی مەدی لین
# مقدار مد اللين

## ئاگاداری
## تنبيه

*ئەگەر قورئان خوێن دەستی کرد بە خوێندنەوەو بە یەکێك لە سێ ئەندازەکەی پێشوو بۆ مەدی لین، ئەوە لەسەری بەردەوام دەبێ تا کۆتایی قورئان خوێندنەکەی.

-إذا بتدأ القاري تلاوته باحد المقادير الثلاثة السابقة لمد اللين فانه يستمر عليه حتى ينهي تلاوته.

* پەیوەندی ( مەدی لەناکاوی سکون ) بە ( مەدی لین ).

ئەگەر لە خوێندنەوەی قورئان ( مەدی لەناکاو سکون ) لەگەڵ مەدی ( لین ) کۆبووە، ئەوە پێویستە ئەندازەی ( لین ) یەکسان یان کەمتر بێت لە مەدی (سکونی ناکاو).

-علاقة المد العارض للسكون بمد اللين:

إذا اجتمع في التلاوة مد عارض للسكون مع لين فيجب ان يكون مقدار اللين مساويا او اقل من المد العارض للسكون.

## کۆبوونەوەی ناکاو وو ئاسان
## اجتماع العارض مع اللين.

| مەدی ناکاوی سکون ( المد العارض للسكون ) | مەدی ئاسان ( مد اللين ). |
|---|---|
| ٢ | ٢ |
| ٤ | ٢-٤ |
| ٦ | ٢-٤-٦ |

ئەمەش چونکە ( مەدی لین ) درێژکراوەتەوە تەنها لەبەر ئەوەی بە ( مەدی ناکاو ) دەچێت، کەواتە نابێت وێچوێندراو درێژتر بکرێت لەوەی پێی چوێندراوە.

وذلك لان مد اللين لم يمد الا تشبيها بالمد العارض للسكون فلا يجوز تطويل المشبهَ على المشبهَ به.

## جۆرەکانی مەد
## أقسام المد

| ڕەسەن ( سروشتی )وە لەگەڵی دایە هەریەك لە : أصلي( طبيعي ) يلحق به : | لاوەکی( فرعي ) همزە ( همز ) | زەنە( سکون ) |
|---|---|---|
| ( ٢ ) لەجیاتی( البدل ) | بەیەکگەیشتوو متصل | ( ٦ ) پێویست( لازم ) |
| ( ٢ ) قەرەبوو ( العوض ) | پچڕاو منفصل | (٢ ، ٤، ٦) لەناکاو تووشبوو بە سکون ( عارض للسكون ) |
| ( ٢ ) گەیاندنی بچووك ( الصلة ا لصغرى ) | گەیاندنی گەورە وەکو پچڕاو دەبێت صلة كبرى ( تلحق بالمنفصل ) | ( ٢ ، ٤، ٦ ) ئاسان( اللين ) |

# ئەو هەڵانەی کە ڕوو دەدەن لەکاتی دەربڕینی ئەلیف ی درێژ
# أخطاء تقع عند النطق بالألف المدية

١- نەکردنەوەی دەم بە ئەندازەی پێویست لەکاتی دەربڕینی.
- عدم فتح الفم بالمقدار المطلوب عند نطقها.

٢- تێکەڵکردنی دەنگەکەی بەشتێك لە دەنگی (یاء).
-خلط صوتها بشيء من صوت الياء:

وەکو( نحو) : ﴿مُوسَىٰ﴾ ﴿مَٰلِكِ﴾ ﴿ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾

٣- تێکەڵکردنی دەنگەکەی بە شتێکی وەکو دەنگی (واو).
خلط صوتها بشيء من صوت الواو:

وەکو( نحو) : ﴿خَٰلِدِينَ﴾ ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾

٤- قەڵەو کردنی لەو شوێنانەی کە باریكو تەنكو ناسك.
تفخيمها في محل الترقيق:،

وەکو( نحو): ﴿ٱلنَّهَارَ﴾ ﴿ٱلنَّارَ﴾ ﴿ٱلۡبَٰطِلَ﴾

٥- باریککردنو ناسککردنی لەو شوێنانەی کە قەڵەوە.
ترقيقها في محل التفخيم:

وەکو( نحو): ﴿خَٰلِدِينَ﴾ ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾

٦- تێکەڵکردنی دەنگەکەی بە شتێك لە دەنگی مینگە.
خلط صوتها بشيء من صوت غتنة.

وەکو( نحو): ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ ﴿ٱلۡقُرۡءَانُ﴾.



# چەند هەڵەیەك كە ڕوودەدەن لەكاتی دەربڕینی واوی درێژ
# أخطاء تقع عند النطق بالواو المدية

١- خڕنەكردن و كۆنەكردنەوەی دوولێوەكان بەئەندازەی پێویست لەكاتی دربڕینی.
-عدم ضم الشفتين بالمقدار المطلوب عند نطقها.

٢- زیادە ڕۆیی لە پاڵە پەستۆكردنی لەسەر دوو لێوەكان لەكاتی دەربڕینی.
-المبالغة في الضغط على الشفتين عند نطقها.

٣- تێكەڵكردنی دەنگەكەی بە شتێك لەدەنگی ئەلیف.
-خلط صوتها بشي من صوت الألف.

٤- تێكەڵكردنی دەنگەكەی بە شتێك لە دەنگی یاء
-خلط صوتها بشي من صوت الياء.

٥- تێكەڵكردنی دەنگەكەی بە شتێك لە دەنگی مینگە.
-خلط صوتها بشي من صوت الغنة.

**نموونە : أمثلة ):**

﴿تَعۡلَمُونَ﴾ ﴿يُوقِنُونَ﴾ ﴿ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾

# ئەو هەڵانەی ڕوو دەدەن لەکاتی دەربڕینی (یاء ) ی درێژ
# أخطاء تقع عند النطق بالياء المدية

١- شۆڕنەکردنەوەی مەلاشوی خواروو بەئەندازەی پێویست لەکاتی دەربڕینی لەگەڵ تێکەڵککردنی دەنگەکەی بەشتێك لە دەنگی ئەلیف.

- عدم خفض الفك السفلي بالمقدار المطلوب عند النطق بها مع خلط صوتها بشيء من صوت الألف.

٢- زیادەڕۆیی کردن لە پاڵە پەستۆ کردن لە سەر ناوەڕاستی زمان لەکاتی دەربڕینی (یاء ) ی درێژ بە تایبەتی لە ووشەی ( إيّاك ) ، ( أيّ ).

- المبالغة في الضغط على وسط اللسان عند نطق الياء المدية.

٣- تێکەڵکردنی دەنگەکەی بە شتێك لە دەنگی مینگە :

- خلط صوتها بشيء من صوت الغنة :

نموونە : أمثلة ): ﴿نَسْتَعِينُ﴾ ﴿ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ ﴿ٱلْمُتَّقِينَ﴾



## ئەوانەی مەدی ناکاوی سکونداریان کردووە بەئەندازەی:
## من مدّ العارض للسکون بمقدار

| دوو جووڵە<br>حرکتین | چوار جووڵە<br>٤ حرکات | شەش جووڵە<br>٦ حرکات |
|---|---|---|
| ئەوە سکونی لە ناکاوی بەهیچ دانەناوە.<br><br>لم یعتد بالسکون العارض | ئەوە سکونی لە ناکاوی بە شتێکی کەم داناوە.<br><br>اعتد بالسکون العارض اعتداداً جزئیاً | ئەوە سکونی لەناکاوی بە تەواوی داناوە.<br><br>اعتد بالسکون العارض اعتداداً کلیاً |

# ئەوانەی مەدی پچڕاویان بە ئەندازەی
# من مد المنفصل بمقدار

| دوو جووڵە<br>حركتين | کەمتر لە گەیاندن<br>أقل من المتصل | وەکو گەیاندن<br>مساوٍ للمتصل |
|---|---|---|
| هیچ گرنگی نەداوە بە هاتنی هەمزە لە وشەی دووەم<br><br>لم يعتد بمجيء الهمزة في الكلمة الثانية | گرنگییەکی کەمی داوە بەهەمزەی ووشەی دووەم<br><br>اعتد بالهمزة في الكلمة الثانية اعتداداً جزئياً | گرنگی داوە بەهەمزە لە ووشەی دووەمو بەتەواوی بایەخی پێ داوە.<br><br>اعتد بالهمزة في الكلمة الثانية اعتداداً كلياً |

# بەهێزترین مەدە
# أقوى المدود

| | |
|---|---|
| پەیوەست<br>اللازم<br>٦ | لەبەر یەکڕایی و یەك دەنگی لەسەر درێژکردنەی و ئەندازەی.<br>للاجماع على مدّه وعلى مقداره. |
| بەیەکگەیشتوو<br>المتصل<br>٤ | لەبەر یەکڕایی و یەك دەنگی لەسەر درێژکردنەوەی و ئەندازەی.<br>للاجماع على مدّه وعلى مقداره. |
| پاشان لەناکاو (تووشبوو)<br>فالعارض | چونکە وەکو پەیوەست دەدانرێ هەمووی یان بەشێك.<br>لحمله على اللازم كلياً أو جزئياً. |
| ئەنجا پچڕاو<br>فالمنفصل | چونکە وەکو بەیەکگەیشتوو دادەنرێ هەموو یان بەشێك..<br>لحمله على المتصل كلياً أو جزئياً. |
| ئەنجا لەجیاتی<br>فالبدل | لە هەموویان بێ هێزترە چونکە حاڵەتێکە لە مەدی سروشتی( ئاسایی ).<br>هو أضعفها لأنه حالة من المد الطبيعي. |

**زانای قورئانخوێن شێخ ابراهیم علی علی شحاتە سَمَنُودی دەڵێ:**

**قال الشيخ المقري ء ابراهيم علي علي شحاتة السمنودي:**

**أقوى المدود لازمٌ فما اتصلْ فعارضٌ فذو انفصالٍ فبدلْ**

واتە: بەهێزترین مەدە پەیوەستە ئەنجا بە بەیەکگەیشتن ئەنجا لەناکاو پاشان پچڕاوو پاشان لەجیاتی.

# بەهێزترین مەدە
# أقوى المدود

**تێبینی**

مەدەكانی تر لەسەر یەك مەد كۆنابێتەوە بۆیە باس نەكران.

**ملاحظة**

باقي المدود لا تجتمع على مد واحد لذلك لم تذكر.

**بنەما (بناغە)**

ئەگەر زیاتر لە هۆكارێك كۆبۆوە لە یەك پیتی مەد، ئەوە هۆكارە بەهێزەكە بە گەڕدەخرێ و هۆكارە لاوازەكە فەرامۆش دەكرێ، وە گەر وەك یەك یەكسان بوون، ئەوە هەردووكی بە گەڕدەخرێ.

**قاعدة**

-إذا اجتمع اكثر من سبب على حرف مد واحد أعمِلَ السبب الأقوى وأهمِل السبب الأضعف فاذا تساويا بالقوة أُعمِلا معاً

**زانای قورئا نخوێن شێخ ابراهیم علی علی شحاته سمنودی دەڵێ:**

قال الشيخ المقري ء ابراهيم علي علي شحاتة السمنودي:

أقــوى الــمدود لازمٌ فمــا اتــصلْ

بەهێزترین مەد پەیوەستە ئە نجا گەیشتی

فعــارضٌ فــذو انفــصالٍ فبــدلْ

ئە نجا لەناكاو ئە نجا پچڕاو پاشان لەجیاتی

وســببا مــدِ إذا مــا وُجــدا

وە گەر دوو هۆكاری مەد پێكەوەبــوون

فــإنّ أقــوى الــسببين انفــردا

كامەی بەهێزترە ئەو حەقــی خۆیەتی

## كۆبوونەوەی پەیوەستو لەجیاتی
## اجتماع اللازم والبدل

گەر پەیوەستو لە جیاتی لە پیتێکی مەدا کۆبۆوە ئەوە پەیوەستەکە بەگەڕدەخرێو لەجیاتی فەرامۆش دەکرێ بەگوێرەی بناغەی بەهێزترین هۆکار.

وەك: .

﴿ءَآمِينَ﴾ ﴿ءَآللَّهُ﴾ ﴿ءَآلْـَٔـٰنَ﴾

إذا اجتمع اللازم والبدل على حرف مد واحد أعمِلَ اللازم وأهمِلَ البدل عملاً بقاعدة أقوى السببين

نحو:

﴿ءَآمِينَ﴾ ﴿ءَآللَّهُ﴾ ﴿ءَآلْـَٔـٰنَ﴾

## کۆبوونەوەی گەیشتوو لە جیاتی
## اجتماع المتصل والبدل

گەر گەیشتوو لە جیاتی کۆبوونەوە لەیەك پیتدا ئەوە گەیشتوو کاری پێ دەکرێو لەجیاتی فەرامۆش دەکرێ بەگوێرەی بنەمای ( بەهێزترین هۆکار ) وەکو:

إذا اجتمع المتصل والبدل على حرف مد واحد أعمِلَ المتصل وأهمِل البدل عملاً بقاعدة أقوى السببين

نحو:

﴿رِئَآءَ ٱلنَّاسِ﴾



# کۆبوونەوەی بەیەکگەیشتوو و ( تووشبوو بە زەنە )
# اجتماع الـمتصل والعارض للسکون

گەر گەیشتوو و تووشبوو بە زەنە کۆبوونەوە لە یەك پیتی مـەدی ئـەوە هۆکـارە بەهێزەکە بەگەڕ دەخسترێ و لاوازەکە فەرامۆش دەکرێ، وە گەر وەکو یەك یەکسان بوون لە بەهێزی ئەوە وەکو یەك بەکاردێن وەکو:.

وەك: .

﴿السَّمَآءِ﴾ ﴿السُّوٓءَ﴾ ﴿وَجِاْيٓءَ﴾

إذ اجمع المتصل والعارض للسکون علی حرف مد واحد أعمِلَ السبب الأقوی وأهمل الأضف فإذا تساویا بالقوة أعمِلا معاً نحو:

﴿السَّمَآءِ﴾ ﴿السُّوٓءَ﴾ ﴿وَجِاْيٓءَ﴾

| گەیشتوو بەتەنها المتصل منفردا | لەناکاو بە تەنها العارض منفردا | لەکاتی کۆبوونەوە عند الاجتماع | هۆکارەکە السبب |
|---|---|---|---|
| ٤ | ٢ | ٤ | زەنەکـەمان فـەرامۆش کـردووە هەمزەکەمان بەکارهێناوە. أهملنا السکون وأعتددنا بالهمز |
| ٤ | ٤ | ٤ | مەدێك دوو هۆکاری هەیە. مد لە سببان |
| ٤ | ٦ | ٦ | زەنـەمان بـەکارهێناوە بـەهۆی هەژماردن و هـەڵگرتنی بـۆ سـەر پەیوەسـت بـە تـەواوی، وە گەیشتوومان فەرامۆش کردووە. اعتددنا بالسکون بسبب حمله علی اللازم کلیاً وأهملنا المتصل. |

